پروانین و بیرکه ینه وه

# شاره هه نگ






وه رگیرانی: عه بدولکه ریم بی ئازار شیرازی

وه رگیر بو کوردی: محه مه د صالح ئیبراهیمی (شه پول)




# شاره‌هه‌نگ

نوسراوی: عه‌بدولكه‌ریم بی‌ئازار شیرازی

وه‌رگیر بو كوردی: محه‌مه‌د صالح ئیبراهیمی (شه‌پول)





این کتاب با تسهیلات مادی وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی چاپ شده‌است.





شاره هه نگ

نوسراوی:عه‌بدولکه‌ریم بی‌ئازار شیرازی

وه‌رگیرانی‌بوکوردی: محه‌مه‌د صالح ئیبراهیمی (شه پول)

چاپی: یه‌کەم ۱۳۷۴

تیراژ: ۱۰ هه‌زار دانه

چاپی و بلاوه‌ی:نویسنگه‌ی به‌لاوه‌ی فه‌رهه‌نگی ئیسلامی

فروشگاه مرکزی: خیابان فردوسی، روبه‌روی فروشگاه شهر و روستا. تلفن: ۳۱۱۲۱۰۰

فروشگاه شماره یک: میدان انقلاب، بازارچه کتاب. تلفن: ۶۴۶۹۶۸۵

فروشگاه شماره دو: میدان نیاوران(شهید باهنر)، جنب مهمانسرای وزارت امور خارجه. تلفن: ۸۰۳۲۲۷۲

فروشگاه شماره سه: میدان حسن آباد، فروشگاه اتکا. تلفن: ۶۴۶۹۸۲۷

**بەناوی خوای دەهندەو دڵۆفانو دڵلاوێن**

**بە رکوڵو سەرەتا**

منی هەنگی هەنگوین جانەوەرێکم تۆئەی مرۆڤ لە هەمو شوێنێک تێم ئەروانی زۆر جاران بەچکۆڵەو هەروایی ئەمهێنیتە ژمار بێجگە لەهەنگوین شوێنەورای ترم لێنابینی، بەلاّم من ئەمرۆکە تۆبانگ ئەکەمە ناو پلورەکەمان تا هەندێ لەنەهێنییەکانی ژیانورازی ئافەرینشمان لەنێزیکەوە بروانی.

ئەی مرۆڤ! لەتەکمنا وەرە تاپلورەکەمان بە تۆنیشان دەین ...ئەگەرچی شارەکەمان لەبابەت درێژیو پانییەوە لەنیو میتر تێناپەرێ بەلاّم هەر ئەمشارە بەرتەسکە ئەتخاتەسەر سورمانەوە.

گەلۆ! هەر ئەمەکە تۆ خۆت بە شەریفترینی بونەوەران ئەزانی.

ئەی مرۆڤ! لە سەرەتاوە لە بابەت ئەندازەوە بەوردی لەمشانەشەش گۆشانە بنوارە کە چلۆن؟ لەوپەری پتەویدا خوشیک سازکراونو کەمیشی کەرەستە تیدا بەکار براون.

لەم شارە هەنگەدا جۆرە رەوشتێکی بەتەکۆزو ورد بۆ هەڵ سوراندن لە گەڵ کرێکی بێ وێنەو تێکۆشانێکی بێوچانو بێماندوبون ئەبینی، جا ئەگەر لەئافەرینشی هەر یەکەمان بنواری ئەبینی کە هەریەکەمان بۆ کاری تایبەت خولقاوین، خوایش هەمو کەرەستەو شتو مەکی کاری بەجۆرێ شیاو پێداوین.

خولقاندن هەمو بۆ ئاگاداری خاوەن دڵە — دڵ نەبێ خوا ناسینیش هەر نابەدڵە

ئەمگشتە نەخشە عەجباتەوا هەن لەبان دەرو دیوار — هەرکە هزر نەکاتۆ نەخشەو وا لەبان دیوار

ئاو لەبەرد هەل ئەقوڵی و باران لە هەور — هەنگوین لەهەنگ و دوڕ لە زریوار

تادا دێ ئەو دیو قسە لەچاکەو هێزی خوایە — پێشینان گوتویانە: قسە هەزارە یەکی بەکارە

## سەرەتا
## شارە هەنگ

ئەڵێن: هەنگی هەنگوین ساز، گیاندارێکی کۆمەڵایەتی یە لە کۆمە ڵانی ڕێک و پێک وبەتەگوزا ئەژی، جا بۆ ئەوەی کەچونیەتی دەرکەوتنی کۆمەڵی هە نگ بەو ڕێک وپێکیەوە تێ بگەین پێویستە کەوشەنی ژیانی کۆمەڵایەتی باش شی بکەینەوە. لەم بابەتەوە زۆر قسەهە یە بەڵام دوکتور «ئیکس مورتان» سنوریکی بۆ ئەم لێکوڵینەوانە داناوەو توانیویەتی کەئەم کارەپیش‌بخات وجوان شی بکاتەوە... دوکتۆر (ئەی دیمس) وای بۆ چوە کە ژیانی کۆمەڵایەتی هەنگ (ئەو گەزندە کۆمەڵایەتی یە) ئەو گەزندەیە کەلە ناو کۆمەڵێک دا ئەژی کە لە دایک وباوک‌یان: بەلانی کەمەوە، لە مێ یەک پەیا بوە کە تۆو گەرای کردوەولەگەڵ بێچولەکانیدا یەو لەگەڵ ئەوانا ئەژی.

ئەندامانی ئەم دو نەوە یە، لەشۆینێک ولە لە ژێر بنەمیچێک، ویا خۆ خانو یەکدا، ئەژین و گەلێ‌ها و کاری، هەمە جۆرەشیان، لە ناودا هە یە.

خۆ ئەگەرئەم زانینە بە لامانەوە، پەسەند بێ و لەگە ڵیا بڕوین بۆمان دەرئەکەوێ‌گە ئەم هەنگە کۆمەڵایەتی یە، تەمەنی دایکەکانیان، لەهەمو ئەندامی خێزانەکانیان درێژ ترە.

کەچی ئەو گەزەندانەی کەوا ژیانیکی کۆمەڵایەتیان نییە، سێ یە کێکیان، بەر لەوەی‌گەراکانیان، هەڵێنن و بەچکەکانیان مل قوت بکەنەوە، ئەمرن.

ئەم تەمەن درێژی دایکە، لەژیانی کۆمەڵایەتی هەنگ‌دا ئەڵێن، پەیوەندی بەوە هەیە کەهەمو هەنگی ناوشارەهەنگ لەدایکە، ئاگاداری ئەکەن وسەرگوڵی هەنگوینەکان، ئەخوا.

گۆڕانی پەروەردە کردنی هەنگ ـ هەموئەزانین لەسەرە تاوە، هەنگ «ماڵی» نەبوە وبەدەستی بەرەی ئینسان، نە ژیاوە، بەلکو لەئەشکەوت‌ولەنا و هوڵۆلایی، تاشەبەردی ناوچیاوزەردا ولەناو بۆشایی وقەڵەشی دارا، شانەی ساز کردوەوژیاوە. تاکەم کەم ئینسان پلورەی بۆمێش هەنگوین ساز کردوەو

«ماڵی» کردوه هەڵبەت دوای ئەوەی بەرەی مرۆڤ بایەخی هەنگوینی بۆ دەرکەوتوە.

کاتێ مرۆڤ ئەڕوانێتە مێژوی پەروەردە کردنی هەنگ لە لایەن مرۆڤەوە گۆیا لە ۱۸۵۱ زاینی دا زانایەک بە ناوی (لانکستو ڕۆثی) دوای سەرنج دانێ فرە، بۆی دەرکەوت، کە هەنگ چلۆن بەوردی، شانە دروست ئەکا بەتایبەت بەشتێکی چەسپناک کە «مێوە» دیوارەی حوجرە و هێلانەکەی و گەرا و هەنگوین ساز ئەکات ئەوە بو، ئەو زانایە، بۆ ئەوەی هەنگ زۆر خۆماندونەکا ولەباتی دیوارە دانان و شانەسازکردن، هات سنوقێکی تەختەی وەکو شانە بۆ هەنگ دروست کرد کە ئیتر هەنگ خەریکی هەنگوین سازکردن بێت.

دوای ئەم زانایە (گهنوس میهرینگ) ودوای (فرازثالی) لە ساڵی ۱۸٦٥ زاینیدا لەمادەیەکی تایبەت کەوەکو مێو، نەرم بو بەشێوەی شانە، شانەسازیان کرد، کە کارو کۆیرەوەری کەم بکاتەوە و هەنگ لەباتی شانەودیوارە ولانە سازکردن هەرخەریکی هەنگوین سازکردن بێ.

ئەوانەی وا لەیەک شارە هەنگدا واتا: لەیەک پلورەدا ئەژین ئەمانەن:

۱ـ شاژن یادایکە. ۲ـ مێ یینە، ئیشکارەکان.

۳ـ هەنگەنێرەکان.

سەرنج ڕاکێشە لەناوهەر پورەو پلورەوشارێکدا تەنیا یەک دایکە، ئەبێ هەبێ، دوشاژننا بێ هەبێ ـ ئەم دایکە، لەهەمو هەنگی نا وپورە و پلورەکەدرێژ ترو گەورەترە، بەلای کەمەوە، تا چوارسال ئەژی و تەمەن ئەباتە سەر، زگی لەسکی گشت هەنگی نا وشارەکە باریک ترە، باڵەکانی ناگاتە لای چژوپاشوی. لاقی لەلاقی مێینە ئیشکارەکان، درێژە ترە، لاقەکانی چاڵی کۆکەرەوەی دەنکی، تیانییە، نەچیلە دان ونە جیکلدانەی، هەنگوین جەمەوەکردن، وەنەلۆی بۆ دەردانی مێو هەیە پزدانیشی گەورەیە. چژی بۆگەزین و پێوەدان بە شاژنێکی ترنییە، ڕەنگی دایکە ئەگۆردری و دێتەسەر ڕەنگی هەنگی ناوشارەکەی خۆی.

۲ ـ مێ یینە ئیشکارەکان ئەمانەپزدانی چکۆڵەیان هەیەولەهی دایکە چکۆڵەترەو بۆگەرا دانان نابێ، وە بچوکترین، ئەندا مێ ناوشارەمێش هەنگوینن.

وەلەهەرپلورە وشارێکا چەنە هەزارێک هەن. باڵیان بۆهەڵفرین بەقەوەتە - هەردوپشتی قاچیان وەک، کەوچکە و سەوتە بۆدانەکۆکردنە وەی، گوڵوایە لەزگیشیان چوارلۆهەیەکە مێو دەرئەدەن و دیوارە شانەی پێی ساز بکەن. لەداوێنی زگیشەوە، شتێکی گەزتن «چز» هەیەکە بۆ بەرگری لەخۆیان، لەکاتی خۆیدا، بەکاری ئەبەن.

٣- هەنگەنێرەکان - ئەمانە، لەمێینیە ئیشکارەکان درشتترن - پاشویان، پانەو بەمو: «توک» دا پۆشراوە.

باڵەکانیان پانترو گەورەتر و پتەون، لەکاتی فرینا وێرە وگڤەی دێ. دوچاوی زەقیان هەیە، ئامێروخوتومیان نییەکەبتوانن شیلە و شیرەی گوڵ بمژن و بیکەنە هەنگوینهەروا لاقەکانیشیان بۆ دەنکە توی گوڵ، کوکردنەوە ناشێ لەنا وهەرپورە و پلورە یەکدا چەن سەت سەرێک نێرە هەنگ هەیە. لەشانەش دەرنا کەون تەنیا پاییزانکە (مێیینەکان) خۆیان گورجەوەئەکەن و نێرەکان ناچار ئەبن دەرکەون.

لێرە دا چەن پرسیار دێتەگۆڕ وەکو ئەمانە:

چ شتێک بووەتە هۆی ئەم جیاوازی یە لەناو ئەندامانی ناو یەک شارە و پلورەهەنگا.

ئەوکارانە چلۆن لەنێوان ئەومیش هەنگوینا نەدا، وا دابەش کراوە ئەوخو ونەریتانە چییە وادەسەلاتی بەسەر ئەم کۆمەلە یەدا هەیە ئە و زمانەچی یە وائە نداماني کۆمەڵەی هەنگی ناو پورە و پلورە قسەی پێی ئەکەن ئەم پرسیارانە و پرسیارانێ زۆر پێویستیان بەلێکۆڵینەوە و توێژانەوەیەکی زاف بەرفرەهەیە بەیارمەتی یەزدان ئەکۆشین زۆر بەوردی و بەشیاوی بەپێیقورئان وەلامی ئەم پرسیارانە بۆ ئێوە شی بکەینەوە.

**ژیانی سەرنج راکێشی مێش هەنگوین:**

بەراستی مێش هەنگوین ژیانێکی سەرنج راکێشی هەیە لە رابوردوا کەمتر وە ئەمرۆ کە لە سۆنگەی سەرنج دان و ورد بونەوەی هۆزانان زاف بەر فرەتر ئەم نوکتەیە چەسپاوەودیاری کراوە کە مێش هەنگوین دارای یەک ژیانی زۆر بە نەزم و پر تەکۆزە، وەلە روی بەرنامە و دابەش کردنی کار و بەرپرسیاری و نەزمێکی زۆر وردە وەیە، پلورە و شارە مێش هەنگوین کە پاکترین، پر تەکۆزترین و پرکارو کردەوەترین شارە، شارێکە، یا شارەییکە، کە بە راوەژوی هەمو شارو گوندەکانی بەرەی مرۆڤ بێکاری و هەژاری تیا نییە و خودانی ژیار و تەمەدونێکی ورشە دارە، تاکی کە لەوەکێش و ئەرک نەناس لە شارە هەنگا، کەمتر هەیە، ئەگەر هەڵکەوێ لە دە رەوەی پلورەدا مێش هەنگوینێک لە بەرکەم تەرخەمی لە گوڵی بێن ناخۆش یا زیاناوی نیشتبێ هەر لەدەم دەروازەی پلورەکە دا بازرەسی ئەکرێ و لە زیمنی یەک موحاکەمەی سارایی دا، حوکمی نابودی بەسەرا ئەدرێ.

(میتیرلینگ) زانای ژی ناسی بلژیکی، کە زۆری سەرنجی ژیانی مێش هەنگوین داوە ولیان روانیوەو لە هاتو چۆیان ورد بۆتەوە، وەلە بابەت نەزم و نیزامی سەر سورمانی شارە و پلورەی هەنگا ئەوا ئەنوسێ:

««مەلەکە»» یا باشتر بڵێن دایکەی ناو پلورە لەشارە و پلورەی مێش هەنگوینا ئەو جورەی وا ئێمە بیر ئەکەینەوە فەرمانفەرما نییە، بەڵکو ئەویش وەکو ئەوانی تر لە ناو ئەو پلورەیەدا مل کەچی نەزم و نیزام و رەسم و یاسایێکە. ئێمە نازانین ئەم رەسم و نەزم و نیزامە لە کوێ دائەنرێ، چاوە روانین رۆژێک بتوانین پەی بەم مەبەستەبەرین و دانەری ئەم ریبازو نەزم و نیزام و رەسمانە بناسین و بیان زانین بەلأم ئێستا بە شێوەی ئیرەتی: (مووەقەت) بە ناوی (گیانی پلورە) یا رۆحی پلورە، ناوی ئەبەین!

دایکەش وەکو ئەوانی تر لە گیانی پلورە پەیرەوی ئەکا ئێمە نازانین گیانی پلورە لەکوێیە؟ وە لە کێهە شانە هەنگوین دایە؟ بە لأم ئەزانین گیانی پلورە، وەکو غەریزەی پەلەوەرانی ترناچێ، وە هەر وەهاش ئەزانین، کە گیانی پلورە،

یەک خوولیّ نەوینی کویّر کویّرانەی بەرەی میّش هەنگوین نییە، گیانی پلورە، ئەرک و ئەسپاردەی هەر یەک لە میّشەکانی ناو پلورە بە پیّی شیاوی و کارو لیّهاتوی یان دیاری ئەکا و هەر یەکەیان ئەنیّریّتە بەر کاریّک.
گیانی پلورە بە میّش هەنگوینە ئەندازیار و بەننا و کریّکارەکان دەستور ئەدا شانە ساز بکەن گیانی پلورە لەروّژ و کاتیّکی دیاری‌دا بە گشت هەنگەکانی ناو پلورەکە، فەرمان ئەدا کە لە پلورە بچنە دەریّ و پورە و شلغە بدەن وبوّبە دەس هیّنانی هیّلانەی تازەو نوّی خوّیان بدەن بە دەس روداوەی نا دیار و خوّ بخەنە ناو دەرد و مەینەتەوە!
ئیّمە ناتوانین بزانین قەوانینی شارە میّش هەنگوین لەلایەن گیانی پلورە دانراوە لە کیّهەکوّری راویّژا، دەخریّتە گوّر و لیّ دەبریّن بەریّوەی ببەن و کیّ یە وا فەرمان ئەدا، کەلە روّژی دیاری کراوا بروّن.
ئەریّ! لە ناو پلورەدا بەر کولّی کوّچ کردن بوّ بەریّوە بردنی فەرمانی ئەوەی وا چارە نوسی میّش هەنگوینەکانی بە دەسەوەیە ساز و ئامادە ئەکریّ.
(٣٥ و ٣٦ میش هەنگوین، نوسراوی میترلینگ)
بەلاّم ئەشیّ بیّژین ئەگەر ئەو زانایە لە بەر ئەوەی میّشکی بەلغی ئەنبوژەنی و ماددی بوّکشانی لیّ نیشتووە، بە نا روناکی قسە لەم مەبەستە ئەکا، ئیمە بە کەمیّک سەرنج دان بەریّنوّینی قورئان زوّر بە چاکی و روناکی بومان دەر ئەکەویّ کە ئەو هەمووە نەزم و بەرنامەیانە، لە کوّی وەیەو ریّک و پیّک کارەوە و فەرمان دەری ئەوانە کیّیە؟!
قورئانی پیروّز چەن بە جوانی و پڕواتایی یەوە فەرمویەتی:
(وَ اَوْحَیٰ رَبُّکَ اِلَی النَّحلِ ...)
پەروەردگارت بوّ میّش هەنگوین وەحی و ئیلهامی زاتی و غەریزی نارد.
ئاللەمە تەر و پاراوتر و پڕ و وتەژی تر و گوّیاتر بە زار و زوانی هیچ کەسیّکا نایە و نەش هاتووە، هەرچی لە بابەت‌ئەم گیان‌لە بەرە ئیسک سوک و رەزا شیرن و بەکەلّکە وە، قسە بکەین هیّمان هەر کەمە بە لاّم هەر چەن قسەش بوّ پەی بردن بەگەورەیی و مەزنی پەروەردگار بوّ ئەوانەی وا خودان هرزو بیرو ئەندیّشەن و

باش ئەروانن و جوان سەرنج ئەدەن و لە شت ورد ئەبنەوە و تیّ دەفکرن بەسە.
پێشینان و تویانە: ئەوەی کەسە، قسێک بەسە. ئەریّ، هەر وەکو خوا خوّی فەرمویەتی : اِنّ فِي ذٰلِكَ لَاٰيَةٍ لِقَومٍ يَتَفَكَّرُوْنْ.
لەمەدا نیشانەیەکی روناک هەیە بوّ ئەوانەی‌وا خودان هرزوبیرن‌و تیّ دەفکرن.
یەکەین زانکو و ئاخرین پێغەمبەرە (شەپۆل).
دوشەمە ١٣٧١/٣/٣٠ - ٢٣ رەبیع‌الاول ١٤١٣ - ٢١ سپتامبر ١٩٩٢




قورئان سورەتێکی بەناوی: (هەنگی هەنگوین) تایبەت کردووە لەوا سەبارەت بەرازی ئافەرینشی ئەمجانەوەرە بەکەڵکە ئاوای فەرموە:

پەروردگارت بەهەنگی فێرکرد، وەحی و ئیلهامی زاتی خستە دەرونیەوە

بەراستی ئینسان لەراست پلورە هەنگا، سەرسام ئەمێنێو لەخۆی ئەپرسێ: کە ئایا ئەمهەموە رەسمو یاسا تەکوزەوە ردە کەلەژییانی هەنگایە، لەکوێوە سەرچاوە ئەگرێ؟

قورئان لەو ئایەتەی سەرەوە پەردەی لەرازی ئەمەبەستە هەڵداوەتەوەو فەرمویەتی: هەر ئەو خوایەی کە وەحی بۆپێغەمبەران ناردوەو پێغەمبەری مەزنی ئیسلامی پەروەردەکردوە ئەم جۆرەشانە هەنگوین سازکردنەشی بەهەنگ فێر کردوە.

## أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا



**لەچیا لەناو قەڵەشتی تاشەبەردو زەردا هێلانە سازبکە**

لەبەر ئەوەی کێوەکان دەستی کەمکەسی ئەگاتێ بۆبەخێوکردنو تێکۆشانی مێش هەنگوین بۆ شانە نانەوەباشن. مێش هەنگوینەکان بەفەرمانی یەزدان لەناو تاشەبەردو زەردا شانەی هەنگوین ساز ئەکەن، کە هەزاران بانو یەکمەنشوری کەسیرولوەجهی هەیە: (دیمەنزۆر).

لەپاشان بەتەکوزێکی سەرنجڕاکێش دەس ئەکەن بەژینێکی کۆمەڵایەتیو لەشیرەی گوڵوگیا، هەنگوینی شیرین، بەرهەم دێنن.

















لەکاتی بەهارا کەگول زۆرو بەرهەمی هەنگوین فەرەئەبێ هەمو رۆژێ هەنگ هەزاران گەرا دائەنێ‌و کونای شانە هەنگوینەکان لەهەنگوین‌و گەرا تەژی ئەبێ، ناچار هەنگەکان پلورەکە بۆبێچولەو پەرەستارەکانیان بەجێ‌دەهێڵن‌و ئەکەونە شوێن مەلەکە وشاژن وکۆچ ئەکەنە جێگایێ تر.

لەناکاو فەزای عابی رەنگی ئاسمان لەبەربزاوتنەوەی هەزاران جوتەباڵی هەنگ ئەکەوێتە تەکان‌و جم‌و جوڵ.




**وه لەناو بۆشایی داریشا شانەو لانەساز بکە**

**ئەو هەنگانەیوا پلورەیان جیٚهیٚشتوە بگەنە هەرلقەداریٚک لیٚی ئەنیشنەوەو پورەو شلٚغە ئەدەنو هەمویان وەکو هیٚشتوەتریٚیکی گەورە ئەم لاولای مەلەکە وشاژن ئەگرن ئەنیشنە سەر یەکترین.**

**جاچەن هەنگ بۆجیٚگا دۆزینەوە بەملاولادا ئەنیٚرن تاجیٚگایەکی خونجاوو شیاو بۆ شانە دانان پەیا ئەکەنو ئەگویٚزنەوە ناوی.**

**جار جارەش هەر ئەودارەیوا هەوەلٚجار لیٚیهەلٚ ئەنیشن بۆشایی، بۆ شانە دانان تیا هەیەو زودەس ئەکەن بەشانە دانانو لانەساز ئەکەن.**




(و...له چیادا وه‌له‌ناو بۆشایی داراو له‌بن میچا(وه‌ له‌ناو پلوره‌ی ده‌سکردا) که‌ به‌ره‌ی مرۆڤ بۆیان سازکردون شانه‌بنێنه‌وه‌و هێلانه‌ ساز بکه‌ن)

جار جار ئه‌وانه‌، وا هه‌نگ به‌خێو ئه‌که‌ن له‌کاتی خوێدا له‌ پوره‌و شلغه‌ی هه‌نگه‌کان به‌لقه‌داره‌وه‌ ئاگادار ئه‌بن. زو به‌سیپالی تایبه‌ته‌وه‌، ئه‌چنه‌ لای پوره‌که‌، وه‌شلغه‌که‌، له‌داره‌که‌ جیا ئه‌که‌نه‌وه‌و ئه‌یان خه‌نه‌ ناو پلوره‌ ده‌سکرده‌کانی خۆیان‌و مێش هه‌نگوینه‌کان له‌ رێگای مێوێکه‌وه‌وا سازی ئه‌که‌ن ده‌س ئه‌که‌ن به‌لانه‌ سازکردن‌و شانه‌دانیان.







**تلۆز تلۆزێکی ورشەداری پوڵەکە لەدولای زگی مێش هەنگوین هەڵئەدەن، ئەم پوڵەکەیە مێوە، بۆلانەو شانە سازی بەکاردێ.**

**لەکاتی هێلانەسازکردنا مێش هەنگوینەکان بەسەر قەلاندۆشی یەکترینا، ئەرۆنە سەرێ و بەدەم پێیانەوە پوڵەکەکان هەڵ ئەگرن و بەئاوی لیکی زاریـان ئـەیکەنە هەویرو ئەی نوسینن بەمیچی هێلانەکەوە.**

**کاتێ پوڵەکەی ئەم تاقمە لەهەنگەکرێکارەکان تەواو بو ئەچن و دەستەییکی تر دێنەسەر ئەوکارە، هەر بەم جۆرە دەستەی سێهەم و چارم و ...تا هێلانەو شانەکانیان بەئەندازیارێکی وردو پوخت سازئەبێ.**

١



٢




هەنگەکان شانە هەنگوینەکانیان شەش گۆشە بەتەشکو قەڵافەو ئەندازەییکی وەک یەکترین سازئەکەن، بەجۆرێکی وا زۆر پتەو بێت و کەمیش کەرەستە بەرێ.

لەوبەشەی وا ئەبێتە هێلانەو شانەی کرێکاران، ئەستورایەکی بەئەندازەی $\frac{1}{5}$ ئینچ ساز ئەکەن لەئاکاما لەهەر دیسیمیتری چارگۆشە ٨٥٧ هێلانە لێی سازئەبێ.

وەلەو بەشەی وا بۆ هەنگەنیرەکان هێلانەو شانە سازئەکەن ئەستورایەکی $\frac{1}{4}$ ئینچ ئەگرن بەجۆرێکی وا لەهەر دیسیمیتری چارگۆشە ٣٥٠ هێلانە سازئەکرێ.

١ ــ النحلة تسبح لله بلغه العلم و لسان الواقع .

... ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمـرَاتِ ...

القرآن الكريم



سا لەشیرەی هەمو جۆرە میوە (وە خونچەو گوڵو گیاییێک) بخو

تاقمێکی زاف فرە لەهەنگە کرێکارەکان ئەسپاردەیانە کەشیرەی خونچەو گوڵو گیا بێن خۆشەکان بگرن، کاتێ یەکێک لەوانە گەیشتەناو کولزارێک، بەرەوناو پلورەکە ئەگەرێتەوەو هەواڵ بەوانی تر ئەداو لەناکاو هەمویان بەرەو ئەوشوێنە پڕگوڵە بۆی ئەکشێن‌و دەس ئەکەن بەمژینی شیرەی گوڵو گیاوخونچەو دوای پڕ کردنی جیکلدانیان بەرەو پلورەکانیان ئەگرینەوە.



....سا بەراستە ڕێگای پەروەردگار تا برۆ

کاتێ گەیشتەوە ناوپلورەکانیان ئەوشیرنیو شیرانەیوا مژیویانە ئەیخەنە بەرباربەرەکان تامەئمورە باربەرەکان ئەوشیرەو شیرنیانە لەدەرونی خۆیانا بیتاوێننەوەو بیکەنە هەنگوینو ئەوسا بییان تکێننە ناو عەمبارەکانەوە.

کرێکارەکان دوای ئەوەی شیرەکانیان دایەوە، دوبارە ئەچنەوە دەشتو ئەمهاتو چۆیە هەروا بەردەوامە هۆزانوانان بەوردبونە بۆیان دەرکەوتوە کە:

هەر هەنگێک بەئەندازەی دەبەرابەر سەنگی خۆیی هەنگوین ئەباتە ناو پلورەوە، وەهەر نیوکیلو هەنگوین نەتیژەی چلهەزار جار هاتو چۆی یەک هەنگە.

## يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ




له دەرونی مێش هەنگوینا شەربەتگەلێ رەنگاو رەنگ دێتە دەرێ

خوا لەدەرونی مێش‌هەنگوینا، یەک دەزگای چکۆڵەی شیمیایی دامەزراندوە: کە لەوا زۆرێ لە(ساکارز) شیرەی هەنگوینە دەڵەمەکە، ئەبێتە قەندی ساکارتر (گلۆکز و لولز)و لەئاکاما شیرەی هەنگوینە نیوەمەیوەکە ئەبێتە هەنگوین، هەنگوینێ، بەرەنگی جیاجیاکەخێوی ئەم شتانەی خوارەوەن:

١ـ ئاو ١٥ تا ٢٥ لەسەت ٢ـ گلوکز ٧٥ لەسەت ٣ـ پروتئین ٤ـ لیباز ٥ـ خویی کانەیی (وەکو پتاسیوم، گوگرد، کەلسیوم، سدیوم، فسفر، ئاسن‌و... ٦ـ ویتامینەکانی جیاجیا ٧ـ مەواددی رەنگی




ئەوسا هەنگە هەنگوین سازەکان ئەچند ناو عەمبارەهەنگوینەکـان، وەئـەوەی‌وا لەدەرونی خۆیانا تاواندویانەتەوەو کردویانەتە، هەنگوین لەعەمبارەکانا، دابـینی ئەکەن.

هەر یەکە لە ئەمبارەکان کەتەژی ئەبن، هەندێ لەو هەنگانەوا ئەسپاردەیان، کە هەوای ناو پلورەو شانەکان خاوین رابگرن، بەسەر ئەمبارەکانا ئەکـەونەهەڵفرو دافرو بەباڵەتەپەی خۆیان فێنکی ئەکەنەوەو ئەوشیرە نیوە مەیوە باشتر ئەمەیێنن‌و هەنگوینەکە توندو سفت ئەکەنەوەو ئەوسا هەندێ‌کرێکار بەمیو درگانەی عەمبارە هەنگوینەکان ئەگرن.






**هەنگوین دەواو دەرمانە بۆ بەرەی مرۆڤ**

هەنگوین کەڵک‌و سودی تایبەتی دەواو دەرمانێکی زاف‌فرەی هەدیە وەکو ئەمانە:

١ـ هەنگوین هەرگیز فاسدنابێ‌و مێکرۆب کوژیشە ٢ـ بو هەزمی خۆراک زۆر بەکەڵکە ٣ـ جەرگی مرۆڤ جوان رائەگرێ ٤ـ بەحافیزەی ئینسان یارمەتی ئەدا ٥ـ مرۆڤ جوان رائەگرێ ٦ـ نەخۆشی جەرگ، ریخۆڵە پشو سوار بون، کەبەد، میعدە، دەمار «ئەعساب»، کەم خوێنی، وەهەروا نەخوشینی چاوو چاوئێشە شێرپەنجە (سەرەتان)ومیزو نەخوشینی ژنانیش دەرمان ئەکات.

## اِنَّ فِى ذٰلِكَ لَاٰيٰاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ



لەکاری مێش هەنگوینا نیشانە هەیە لەسەر هەبونی پەروەردگار بۆئەوانەی وار بیرو هزر ئەکەنەوە

خونچەو گوڵو گژو گیاو داری میوە نیازیان بەگەردەییک هەیە کە هەنگ لەتەک خۆیانا ئەی هێنن و تێکەڵ:(لیفاح)ی نیوەی زیاتر لەوانە لەسۆنگەی مێش هەنگوینەوە دێتەدی.

هۆزانوانان هەستیان بەوەکردوە کە هەنگەکان لەبەرامبەری هەر پێنج تمەن هەنگوین و میویٚکە بەئێمەی ئەگەیینن بەلانی کەمەوە بەئەندارەی یەک سەت تمەن لەکارو باری جوت و گادا یارمەتیما ئەدەن.




**هەموخزۆک و جوڵەندەیەک لەزەویدان و هەمو پەلەوەرێک کە بەباڵەکانیان ئەفڕن گشتیان بونەوەرێکن وەکو ئێوە**

دوای چەند رۆژکە جارێ‌تر لە پلورەکۆنەکە دیدەنی ئەکەین ئەبینین کەگەرایێ فرە هەڵێنراوەو پلورەکە لەبێچولەو گەرا دارماڵ‌و تەژی بوە.

وەئەوەی‌وا ئەبێتە مەلەکە هەڵیداوەو هەندێ پەرستار دەوریان گرتوەو چاوە دێری لێوە ئەکەن‌و خۆراکی تایبەتی بۆدێتن.




لە کاری مێش هەنگوینا نیشانە هەیە لەسەر هەبونی پەروەردگار بۆئەوانەی وار بیرو هزر ئەکەنەوە



## بۆ نارواننە ئەو باڵندانەی وا لە بان سەریانەوە لەفرینان...



کاتێ مەلەکە بەتەواوەتی هەڵیدا لە رۆژی تایبەتا لەپلورە دێتەدەرێ بەهەوادا ئەفرێ و هەنگەکانی تریش ئەکەونە دوای، هەرچی مەلەکە وشاژن بەرەو ژور ئەچێ دەستەی ئەویندار کەمتر ئەبنەوە.

سەرئەنجام مەلەکە ئەونە ئەچێتە سەرەوە تالەوهەموە شازادانە، یەکێک کەلەوانی تر بەهێزتر و ئەویندارترە خۆی ئەگەیینێتە مەلەکەو تێکەڵی لەگەڵا ئەکات و ئەمرێ. وەمەلەکە دوای بوکێنی بەشادمانێکی فرەترەوە ئەگەرێتەوە ناوپلورەکەو دەس ئەکا بەگەرا دانان.




گەراکان دوای چار رۆژ ئەبنە (لارو) ئەم بێچولە سپیانە کە ناتوانن خۆراک بۆ خۆیان گیربێنن، لەهەنگوینی ناو حوجرەکان کە هەنگەکرێکارەکان بەفەرمانی پەروەردگار بۆیان ئازوخە گردون ئەخۆن‌و لەماوەی ١٧ رۆژا پر بەحوجرەکە ئەونەزا، ئەبن.

سەرئەنجام دوای ٢١ رۆژ ئەبنە هەنگێکی تەواو، ئەوسا سەرپۆشی درگانەی حوجرەکە ئەدڕن‌و دێنەدەرێ.

وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ١٧ فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِم حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ١٨ قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ٢٢ فَحَمَلَتْهُ



**بەپێی لێکۆڵینەوەی هەنگ ناسان(مەلەکەوشاژن) بەر لەشوکردن ئەتوانێ گەرا بخات بەڵام گەرای بەر لەشوکردن ئەبنە نێرە.**

**لەلایەکی ترەوە ئەگەر مەلەکەوشاژن گەرای نێر بخاتەوە هەنگە کرێکارەکان کە هەمومێن و شو نەکردو ئەترسن و بەرئاوەژوی یاسای سەلێندراوی پلورە بێ ئەوەی شوبکەن دام و دەزگای گەراخستنەوەی ئەوانە قەوی و بەهێز ئەبێ و وەکو مەلەکە گەرائەخەنەوە. بەڵام ئەوانیش بێجگە لەگەرای نێرە ناتوانن گەرایێ تر دانێن.**

**١ـ هەنگ نوسراوی: موریس مترلینگ**











وەسلێمان وتی: ئەی خەڵکینە زمانی باڵندە بەئێمە فێرکراوە.

مێش هەنگوین خودانی زمانێکی تایبەتن کە لەسۆنگەی ئەوزمانەوە مەبەستی خۆیان بەیەکترین حاڵی ئەکەن. بۆ وێنە کاتێ یەکێک لەوانە دەسیان بگاتە ناوگوڵو گوڵزارێک ئەچنەوە ناو پلورەو بەتەکانو مانوریێ تایبەت نەتەنیا مەوداو رەخی ئەوشوێنە بەیان ئەکەن بەڵکو چلۆنایەتی ئەو جورە گوڵو گیایەش کە دۆزیویانەتەوە دیاردی بۆ ئەکەن بۆراگەیاندنی مەودایەک کە لە ٥٠ میتر کەمتر بێت جەغزێک خول ئەدەنو زیاتر لە ٥٠ میتر خولێکی ئیهتیزازی ئەدەن.

# رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى




**پەروەردگاری ئێمە خوایە کە پێداویستوا ئەوەی‌وا نیازی هەر بونەوەرێکە بەو جۆرەی واشیاوی ئافەرینشی خۆیەتی ئافەریدەی کردوەو (بە کەڵک‌وەرگرتن لەوە) ڕێگایشی نیشان داوەو هیدایەتی کردوە.**

پێی هەنگی‌کارگەرگشت کەرستەی کاری ئەوانەی هەیە.

لەئێسکی سپی وەکو ساقی پێی بۆکۆکردنەوەی گەردەی گوڵ وەلەسیخەکهای تایبەت بوجیاکردنەوەی گەردەکانو سازکردنی گزمولەگەلێ پوڵین (کەرەستەی ناوماڵ) وەکردنەهەویری ئەوە بەتفی لیکی‌دەمی‌و هەلچنییان کەڵک‌وەر ئەگرن.

وەبەو مووە زبرانەی کە هەر وەکو شانەی خوا پێ‌داوی‌یە خۆی پاک ئەکاتەوە.




هەر زیندەوەرێک ژیانی بەئاوە

لەپلورەی هەنگا ئاو زۆر بەکاردێ. هەنگ بۆ گیرهێنانی ئاو بەرەو ئەستێرو چومەڵو چوماو ئەڕۆنو ئاو دەهێننەوە ناوپلورەو، وەکوشیرەی گوڵ بەهەنگەکانی تری ئەدەن کە ئەسپاردەیانە ئاو بەئەندازەی نیاز بەهەمولانەکانی پلورە بگەیێنن و بۆ سازکردنی ژیلەو خۆراکی نایەت بەکاری بەن.

## دەرسگەلیک

## لەژیانی مێش هەنگوین



کونوا في الناس کالنحلة في الطیر

امام علي (ع)

مێش هەنگوین لەناو پەلەوەرانا چلۆنە

ئیوەیش لەناو بەرەی مرۆڤدا وابن.




سوێند بەوانەی کە کار دابەش ئەکەن

یەکێک لەرەمزی سەرکەوتنی هەنگ لەژییانی کۆمەلایەتی خۆیانا ئەوەیە کەلەنێوان خۆیانا کار دابەش ئەکەن هەندێ کاری ناوەوەو هەندێکیش کاری دەرەوە جێ بەجێ ئەکەن ئەونە ئەرک ناسن کەتەنانەت لەدەرەوەی پلورەش شان لەبن کار ناترازێنن.

ئێمەی بەرەی مرۆڤیش ئەبێ بۆ بەدەس هێنانی نەتیژەی باشترو زیاتر کار لەنێوان خۆمانادا بەش بکەین‌و هەریەکەمان لەریشتەو کاری پسپوری خۆمانا ئەرک ناس‌بین.



دەسی ماندو لەسەر زگی تێرە

کارو تیکوشان لەروانگای مێش هەنگوین شتێکی پاکەو هەنگ بۆنیازو تێربون کار ناکەن.

چونکا لەماوەیەکی کورتا ئەتوانن ئازوخەی خۆیان سازکەن بەلاّم لەسۆنگەی ئەوین بەکار جارجارە کرێکارانی یەک پلورە چل یاپەنجا کیلو هەنگوین ئەدەن.

ئێمەی ئینسانیش ئەگەر گرینگی بەکارو تێکۆشان بدەین و کار بەپاکو چاک بزانین زیاتر سەر ئەکەوین و پلەو پایە گیر دێنین.

**وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا**



**هەمو پێکەوە دەس بگرن بەتەنافی (پەیمانی) دینو پەراوەی خواو لێکجیا مەبنەوە.**

یەکێکی تر لە نهێنییەکانی سەرکەوتنی هەنگ رۆحی یەکگرتنە کەلەنێوان ئەوانا هەیەو پێکەوە پورە ئەدەنوکۆچ ئەکەن وەبەیەکەوە هێلانەو شانە سازئەکەنو ئەچنە سەرکار ئەڵێی هەمو یەک گیان لەبەرن.

سەرکەوتنی ئیمەی مرۆڤیش لەسۆنگەی یەکیەتیو هاو دەنگییەوە دێتەدی کەوابو ئەبێ یەک گرین تاسەرکەوینو بەسەر کەندو کۆسپا زاڵبین.



لەرەحمەت و کەرەمی خوا بێ هیوا مەبن

یەکێک لە تایبەتی یەکانی زاتی هەنگ هیواو پایەداری یە، جا لەبەر ئەمە لەشارە کۆنەکە ئەرۆنە دەرێ دەس لە هەمو شتێک ئەشۆنەوەو بەدەسی خاڵی ژینی نوێ بنیات ئەنێن.

ئەگەر کەندو کوسبێکیان بێتەرێی وەک ئەمە پلورەکەیان ئاگر بگرێ تادوا هەناسەو پشو کۆڵ نادەن و هێلانە جێ ناهێڵن چونکا:

لە بێ هیوایی دا هەویا زۆرە          دوای شەوی رەش رۆژە بەنۆرە






بی گوّمان لەژینی هەنگا نیشانەیەک هەیە (لەبونو هیّزو دەسەلاّتی پەروەردگار بوّ مروّڤ گەلیّکوا هزرو بیر ئەکەنەوە.

سەرنج دان لەژینی سەرسام هیّنەری میّشهەنگوین، کە بەوریزەپیزەوە خوّی یەک شاکاری ئافەرینشە ئیّمە بوّ ناسینی خوای مەزن ریّنویّنی ئەکات. چونکا هیچ خاوەن ئاوەزیّک باوەر ناکات کە ئەمگشتە عەجباتی ئافەرینشە هەروا لە خوّوە بیّ، یانیّ:خوّکرد بیّو بیّهزرو بیّ لیّبران بیّت.

# وەحیی و مێش هەنگوین

وَاَوْحىٰ رَبُّكَ اِلَى النَّحْلِ



| وە پەروەردگارت بەمێش هەنگوینی فێرکردو وەحی ئیلهامی زاتی خستە دەرونیەوە. |
|---|

کاتێ ئەزانین کە ئەم جانەوەرە چکۆلەیە، بێ ئەوەی لەژێر دەسی هیچ شەکر ڕێزێکا کاری کردبێ ئاوا بەرێو جێ بۆبێتە وەستای شیرنی سازکردن، وەبی ئەوە فێرگەو زانکۆیەکی دی بێ لەپیشەی بەننایی و ئەندازیاری‌دا پێش هەمو بەنناو ئەندازیاران کەوتبێ، وە بێ ئەوە زانست و زانیاری کۆمەلاّیەتی خوێندبێ ئاوا بەنەزم و شارستانێکی بەرزەوە، دەسی دابێتە ژینی کۆمەلاّیەتی ئەکەوینە یادی پێغەمبەران کە چلۆن بێ ئەوەی چووبنە فێرگە یا زانکۆیەک لەڕێگای خوا پێداوی‌یەوە، وەلەڕێگای فێر کردن و وەحی و ئیلهامی پەروەردگارەوە، خەریکی ڕێنیشان‌دان بەبەرەی مرۆڤ و شارستانی و ژیارو بەختەوەری و ئاکارو خەریکی ڕزگارکردنی ئینسان بن.



گرتمـــان وەحـــی پـــێغەمبەر گـــەنجوریش نـــەبێ
خـــۆ دیـــارە لەوەحـــی هـــەنگ کـــەمتر هـــەر نـــابێ
چونکـــاتێ وەحـــی بـــۆ هـــەنگ هـــاتە خـــوار
تـــێی تـــزا شـــیرنی بـــە کـــۆم بـــە خـــەروار
هـــەنگ فـــێربو مـــژی تـــێر گـــوڵ، کـــردی بەعەسەل
لە هـــەنگوین تـــەژ بـــو پـــلورە تـــەسەل
ئـــایەی (لَـــقَدْ کَرَّمْنـــا) بـــۆ رێـــز لە ئینســـان
کـــوا وەحـــی ئـــەم پـــاین لە حـــەیوان
وەرگیراو لەشیعری مەولەوی
تەواوبو. ١٣٧١ هەتاوی
چاوە روانی چاپی پەراوەی حَیَّ بنِ یَقْظان: (زیندوی بێدار) بن‌بە کوردی هەر لەم وەرگێڕە (شەپۆل).

## فه رهه نگیله

WAJE RAWET

| واژه | راوه ت |
|---|---|
| ئه | ئامرازی گه یاندنی ئایه نده: (ئه خوێم، ئه نوم). |
| ئه رک: | پێویستی سه رشان، کاری لازم، وه زیفه، ئه سپارده. |
| ئه ز: | من، ئه گه ر دیتیانم ئه زم، ئه گه ر نه یان دیم دزم (مه سه له). |
| ئه ستۆ: | سوکر، مل، گه ردن |
| ئه نزان: | مرۆڤ، ئینسان |
| ئه زمون: | تاقی کردنه وه، زمنای |
| ئه ویندار ی: | دڵبون، دڵداری، بێداری، ئاشقی |
| ئه ستێره: | ستێر، ستاره |
| ئه قڵی: | ژیری، هۆشی، هۆش |
| ئه ندێشه: | بیر، هزر، فیکر |
| ئه ده لێته خوارێ: | ئه رواته خوارێ، له ریشه ی ده لێنه، ده لێن: دادان، خزینه خوارێ، کوزه که ئاو ئه ده لێنێ، یانی نمه نمه ئاوی لێ ده چێ. |

ئاسک: مامز، که ژاڵ، خه زاڵ، مامبز

ئاسکۆڵ: بێچو ئاسک، کارمامز.

ئاوابون: بزربون، له به ر چاو لاچون، غروب

ئاوه ژو: پشت و رو، ئه م دیوه و دیو، تیاچون

ئاسایی: مه عمولی.

ئاژاڵ: پاتاڵ، وڵسات، گاوگۆڵ، مه رو ماڵات، پڕ و پوش، جیلکه و چاڵ، ئاژەڵ

ئامێته: تێکه ڵ، تێکلاو، لێکدراو

ئاخه وتن: قسه کردن، وتووێژ، په یوین

ئه بو هوزه یل عه لاف: له ۲۳۵ مانگی له دایک بـوه و له ۸۵۰ زاینی مردوه، بیـره وه ر، و موته که لیمی موعته زیلی بوه، ئه فی سیفات له خوا،إنّ اللّه یَعْلَمْ و إنّ عِلْمه ذاته و له فه لا سیفه شوێنی وه رگرتوه.

ئه شعه ری: ئه بو حه سه ن عه لی کوری ئیسماعیل ئه شعه ری، دژی موعته زیله و سه ر ده سته ی ئه شعه ریانه ؛که بڕوای وایه ئوصولی دین: ته وحید، مه عاد، نبوّه ته، و بڕوای به قه لب و دڵه وله ۲۶۰ له دایک بوه و له ۳۳۰ وه فاتی کردوه و کتێبێ زۆری له پاش به جیماوه: لومعه، موجه ز، ئیزاحِ بورهان، ته بینی ئوصولی دین، ئیبانه، شه رح و ته فصیل له ره دی ئه هلی ئیفکدا.

ب:

بناغه: بنچینه ی خانو، خێم، هێم

بفه: ترس، مه ترسی، خه ته ر

به ل: جوانی قه د باریک، بڵیندتر له ده ور و به ری خۆی، مل به رز، درێژ.

| | |
|---|---|
| به ر: | میوه، |
| برکە: | پنجی بێستان (برکە کاڵەک). |
| بە لاتە: | کە لاک، منداری ئاژە ڵ. |
| باڵە: | دە نگی کاریلە، ئاسک، دە نگی بە رخی ساوا |
| بێدار: | نە خە وتو |
| بێداوی: | لە دوانە هاتو، بێ برانە وە |
| بیرە وە ران: | خاوە ن بیران، زانایانی خاوە ن بیر |
| بە لە ز: | خێرا |
| بە رتە سک: | کە م عە رز، نا بە رین، مە حدود |
| بزۆز: | بێ ئۆقرە، هە ر لە گە راندا، بێ ئارا و قارا، صیفە موبالە غە یە. |
| بێ فە ر: | بە د فە ر، خراپ |
| بزر: | گوم بون، لە بە ر چاولاچون |
| بێ هیوا: | هیوا براو، بێ هومێد |
| بە دیهاتن: | پە یدا بون |
| بە دیهێنە ر: | خوا، موجِدٌ ــ ساز دە ر |
| بە دیهاتو: | پە یدابو |
| بێ برانە وە: | بێ دوابران، بێ نیهایە ت |
| بە ژ: | ویشک، ویشکی، ویشکانی. |
| باو: | داب و دە ستور، مە رسوم، شێوە، رمێن و<br>رە ونە ق.(تیروکە وان لە باو کە وتوە) |
| باری ژیان: | وە زعی ژین |
| بارهێنان: | پە روە ردە کردن، عاملاندن |
| بوز: | گونجان، مە یسە ر بون، خونجان، بوزخواردن، گونجاندن |

به سه رهات: سه ر بوهوری

به خشه ر: ده هه نده، دلّاوا، دلّ لاوێن

## پ

په یوین: قسه کردن، ئاخه وتن

پێل: شه پۆل، مه وج.

پێشواز: به ره و پیرچون، به پیره وه هاتن

پێ لێهه ڵێنان: به رز کردنه وه، چونه قولّایی مه به ست، پێ له ئاش هه ڵێنان بۆ درشت هاڕین

په له: له ز، خێرا، به پێ، ژیان زۆر به پێ به، خێرا ده روا

پۆستین: جلکی له پێست، که په نک

په رێز: جارِ، جارِه گه نمی دروێنه کراو

په رژین: شوره، هه لِي کار له باره ی شتێکه وه، (نام په رژێ) په رژان، ته نینی ده وری شتێک.

پرِ: ته ژی

په ری: حۆری، ژنی جوان و بێخه وش، پاک و له تیف

پولّ: دراو، قۆشه

پروان: سووان، هه پرون، تیاچون

پاژ: حوزء ــ پارچه، کوت، له ت، له تی

## ت

ته کوز: رێک و پێک، له باروبێ که مایه سی، نه زم و ته رتیب

ته ریک: ته نیابون، گۆشه گیر

تیاچون: له ناوچون

تیا ده چێ: له ناو ده چێ

تێپه ربون: هاتن، رۆیشتن، عوبور

ته ژی: پڕ، لێوا و لێو، پڕاوپڕ

تێهه ڵه نگوتن: رو به رو بون، لوت و بزوت، توش یه کترهاتن

تۆف: تۆفان، سه رما، سه خڵه ت

ته سه لسول: زاراوه ی زانستی که لامه، زنجیره.

تازه به دیهاتو: حادیس، تازه

تین: گه رما، ته وژرم

تافگه: قه ڵپه زه، هه ڵدێر، ئابشار، ئاوی به خوڕ، خوڕێن

## ج

جیره: به شه نان و بژیو، موچه و به رات

جار: جێگه گه نمی دوراوه، جاڕه بی، جاره جۆ

جۆ: ده غڵی هه وا ڵی گه نم، جۆگه، جۆبار، شوێنی ئاو پیێدا رۆیشتن.

جو: موسایی، جوله که

جام: کاسه، قاپ، ده فری قوڵی چکۆڵه، شوشه، ئاوێنه، جێگای من، شوێنی من، تاس.

جه وال: تێری یه ک لایی

جا جم: مه وج، ته نراوێکه له خوری، نوێنی تێوه ده پێچن

جه ماد: بێ گیان

جیکه: جیرجیو، زریوه زریو، ده نگی تێکلاوی مه لانی بچوک

جه ربانذن: ئه زمون، تاقی کردنه وه

جیاتی: باتی، له جیاتی، له باتی

## چ

چوار چێوه: چارچێو، چاردار، چار عونصور

چت: شت، تشت، تۆکام شتت «چت له من گه ره که»

چنگڵه سه ره: قژن، سه ر ته پڵه گۆینی.

چالاک: خێرا، به له ز، به پێ

چرچ: لۆچ، ژاکاو، لۆچ به سه ریه کداهاتو، لاواز، له رز له به رسه رما یا له ترسا

چریکه: به یت و باو، داستان: حه ماسی، غه نایی، جه نگی، وه ک مه م وزین، به یتی ئاوره حمان پاشا بابان، سوارۆ، شه م و شه مزین و...

چیرۆک: ئه فسانه، داستان

چز: چزوی دوپشک، زه رکه ته، قرچه ی رۆنی داغ، داغ نان به پێسته وه

چنگال: په نجه ی شێر و پڵینگ، چنگ، قولاپی له ئاسن، هه والّی که وچک، په نجه ی درنده

چاخ: کاو، ده م، کات، زه مان

## ح

حه و جۆش: لولێنه ی مه فره ق، حه و تجۆش، ئافتاوه، مه سینه.

حه یران: ئه وینـدار، بـه نـده وار، عـاشق، سه رلێ شـێواو، هـه وای گۆرانیه کی له مێژینه یه، کـه زۆر به ناو بانگـه، وه ک حه یرانی مه لاکه ریم.

حه سار: حه وش، گۆڕایی ناو چوار دیواری ماڵ.

حادیس: تازه، تازه به دیهاتو، گۆنگه ڵ. روداو.

حصولی: کـه سبی، زانینێکه، کـه به خـوێندن به ده س بێ و حـاسل بێ،

له راست زانستی زه روریدایه،که عیلمی موجه ره داته به زاتی خۆی.

صورتی زیهنی: صوره تی ئه شیا که له زیهندا حاسڵ ده بن و وجودی زیهنی به خۆده گرن، که صووه ری عیلمی و ئه قلّیشیان پێ ده و ترێ، له راست صوره تی حیسّیدا که شکڵ و ره نگی ئه شیای خاریجن، که به حه واس ده بیندرێن.

## خ

خۆر: تاو، رۆژ، نوری رۆژ.

خوور: توند، ئاوی خورێن، خورره: ده نگی که وان که به رانبه ر به یه ک ده بن.

خورێن: خور، نیّرینه ی چه م، که به توندی دێ.

خوله میش: خۆڵه مره، بول.

خراپ: به دفه ر، بێ فه ر، ناچاک.

خێم: بناغه، هێم.

خه بات: تێکوشان ــ بێ پشوکار کردن.

خه سار: زایه، خه ساربوه، زایه بوه، داری ژیر کاریته، بۆ دیوار، له قورسایی کاریته پاراستن.

خه ره فاو: هۆش نه ماو له به ر پیری، خه ره فیاگ.

خووار: که چ، خێچ، لار، لارووێر.

خورپه: ته په ته پ.

خێو: خاوه ن، خێوی کانی، خودان.

خودان: خێو، ساحێو، خاوه ن، مالیک.

خۆرسک: خۆکرد، سروشت، فیتری، ته بیعی.

خارا: له کڵ ده رهاتو، زیره ک، ته قو و چه ف دیو.

## د

دڵ لاوێن: دڵۆفان، لاواندنه وه ی دڵ

دزێو: ناحه ز، ناشیرین

داعبا: جانه وه ر، گیاندار

دوین: قسه کردن

ده س به ده س: ده ستاو ده ست، له گه رِدا، به ره واج، نه غدبه نه غد.

ده سترِی: پاکی ده کرده وه ـ سرین، پاک کردنه وه

دادێ: ده بێ، دێ، گه رم ئه بێ

دۆزینه وه: دیتنه وه، که شف کردن

دنه ده ر: بزوێنه ر، قانه قدیله ده ر

ده هه نده: به خشه ر، ده هنده، دلاوا، دڵ لاوێن

دڵۆفان: به خشه ر، ده هه نده

دژایه تی: دوژمنی کردن، زیدیه ت

دارا: ده وڵه مه ند، ده ست رۆیو، ناوی یه کێ له پاشا ماده کانه

## ر

رێبوار: رێپۆ، موسافیر

رخ: ته ره ف، لا

رزگار: نه جات

ره خسین: سازدان

رۆژی به رێ: په سلان، رۆژی قیامه ت

روشت: هه ڵدان، نمو، سه بک، شێواز، شێو

زمی: ده نگی گریان و نالاندن.

راوه ت: واتا کردن، ته فسیر کردن، لێک دانه وه

رواڵه ت: زاهیر

ره تان: ماندوبون، خۆماندو کردن، حه ول و تیکوشان

## ز

زیندو: زیندگ، مله ی کێو، گیاندار، حه ی.

زاروک: زارۆ، منداڵ، زاروڵه.

زه ریا: ده لیا، ده ریا.

زرێوار: زریبار، ره خی ده لیا، ده ریاچه یه که نێزیک شاری مه ریوان له کورده واریدا، وه ک ده ریا، گوڵ، زه ریا مانه ند، زه ر که کورته ی زه ریایه. وار باشگری ته شبیه: وێنه ی زه ریا

زاراوه: له هجه، ئیستیلاح، شێوه ی تایبه تی قسه کردن، دراوی ده م، زاراو.

زنازنا: هه راو و هوریا، چه قه و گوره زه نا زه نا.

زانین: عیلمی، عیلم، زانست.

زانینی حضوری: عیلمی حوزوری، زانستی که نیازی به که سب نه بێ و حازربێ.

## ژ

ژه نگ: زه نگ، چڵکی سه ر کانزا، به ڵایه کی گه نمه که ما کێکی ره شی ئاڵ سوری لێ ده نیشێ

ژه هر: زه حر، زه هر، سه م

ژین: ژیان، زینده گی

ژار: هه ژار، نه دار، کز، که نه فت

ژیر: ئه قڵ، ئه قڵدار، عوقول

ژیری: ئاقڵی، ئه قڵدار بون، ئه قڵی، هۆشی، هۆش، به هۆش

## س

سه رنج دان: روانین، وردبونه وه

سوراڵ: گه ڕان

سڵه مینه وه: راچه نین، هه ڵاتن، ره می

سۆز: ئه وین، عه شق، شه وق، گڕ، ئاره زو، گڕگرتو

سه رۆک: مه زن، ره ئیس، سه ره ک، گه وره

سه نه م: بوت، ژنی جوان

سینا: بوعــه لی ســـینا، ئه م زانایه له ۳۷۰ له دایک بوه و له ۴۲۸ ی مـانگی له هه مـدان وه فـاتی کـردوه، مــه یلی به ئیـشــراق. و صــوفـیــه تی بوه، زۆر زانابوه و ئه م په راوانه ی نوســیــوه: قـانون لـــه پـــزیشکیـدا. شفـا ،له فه لسه فه دا، ئیشارات و ته نبیهات له مه نتقدا و ...

## ش

شه پۆل: شاپێل، مه وج.

شه پۆل دانه وه: مه وج دانه وه.

شینکایه تی: شینکاتی، سه وزایی.

شینکه: گژوگیای تازه سه رده رهێنا و له ده شت و سارا.

شلوێ: لێڵ، قوراوی.

شێواز: رێباز، شیوه، سه بک.

شهود: دنیای شهود، عاله می عیرفان و خوا بینی، دڵ روناک.

## ع

عه ینیه ت: ئه وه ی به یه کی له حه واس ده رک ئه کریّ، وجودی عه ینی موبیّنی وجودی زیهنی و خاریجی یه.

عیرفان: ناسینی خوا، ناوی زانستیّکه له زانسته کانی ئیلاهـی، که خـوا و په سنی خوای پیّ ده ناسیّنریّ، زاکۆنی خواناسی، یا له ریّگای به ڵگه وه،که تایبه ت به زانایانه،یا له ریّگای پاک راگرتنـی دڵ و ده رو نه وه.

## غ

غه زالی: ئیمام موحه مه د غـه زالی یه کیّکه له زانا گه وره کـان جیـهـانی ئیـسلام کـه له ۵۰۵ ی مـانگی له توس له دایک بوه و له ۱۱۱۱ ی زاینی وه فاتی کردوه و ئه م کتیّبانه ی نوسیوه: ئه حیای علوم دین، مشکات الانوار، المَنْقِذُ مِنَ الضلالِ، نهافت الفلاسیفه و ...

## ف

فیّرگه: مه دره سه، مه کته ب

فیّرانکۆ: زانکۆ، فیّرگه، مه کاتیب

فیکر: هزر، بیر.

فیّر کردن: راهیّنان. تالیم دان، یاددان، ته علیم

فه رز: واجب

فزی: گزی کردن، فیّڵ کردن

فیتری: خۆرسک، سروشستی، خۆکرد

## ق

قاڵب: شتیّ،کـه کانـزای تـاویـاوی تیّ ده ریّـژن. جـه سته، لـه ش،

به ده ن، قوتو، ده فر.بۆ شت فرۆشتن، ژماره بۆ دارژاوی توندە وە بو، قالّبه شه مچه، قالّبه سابون

| | |
|---|---|
| قولّ | بی بن، عه میق |
| قالۆره: | قالۆر، ساقه ته گیای ناوخالّی |
| قرتالّه: | قرتالّ، سه وه ته ی میوه، باغی ترێ. |
| قاودان: | دوکه لّدان،قانگدان |

## ک

| | |
|---|---|
| که ند: | چالّ، چالّه قوت |
| کۆسپ: | قۆرت، ته گه ره. |
| کۆڕ: | کۆمه لّ، ده سته، پۆل |
| کۆمه لّ: | کۆ بونه وه |
| کاکه شان: | ئه ستێره کانی ئاسمان |
| که موسکه: | که م، زه ره، تۆزقالّه زه ر. |
| که ف چڕین: | که ف کردن، شه پۆل دانه وه،سیلاو کردن. |
| که لام: | که لامی، زانینی که لام، که لامی نه فسی یا که لامی له فزی. |
| کارا: | به کار، ئازا، کار زان |

## گ

| | |
|---|---|
| گزینگ: | گزینگی خۆر، ره شێنه ی چاو، بی بیله |
| گه نجه: | گه نجینه، حیکمه ت |
| گه می: | لوتکه، که شتی |
| گه ڕیان: | گه ڕان، سوڕان |
| گۆکان: | کوره کانی ئاسمانی |

گزی: فیڵ، ته ڵه که، فزی، حیله

گۆ: خر، گردیله، گرده، تۆپی دارینی کاشۆ بازی، کـوره، جه غزی زه وی.

گه ش: روناک

گژوگیا: نه باتات، پوش و پار. روه ک

گرِی گرت: ئاوری گرت

گر گرتن: ئاور گرتن

گه رم: داغ

گوێچکه: گوێ، گوهه

## ل

لێکدانه وه: توێژانه وه، ته حقیق

لێکدراو: تێکڵاو، ئامێته

لکاو: پێوه نوساو

له ز: تاڵۆکه، زو، عه جه له

له ش: ته ن، به ده ن، جیسم

## م

مه یسه ر: گونجان، بوز خواردن، مه یسه ربو: جێ به جێ بو

مزوف: ئنیسان، ئه نزان ــ به نی ئاده م

مونکیر: دژ، نه خواز، پۆشه ر، داپۆشه ری حه ق

مه باح: جایز

مه زن: گه وره، سه رهۆز ــ ریش سپی و گه وره .

میعراج: چونه لای خوا، چونه سه رێ، چونه ئاسمان، به رز بونه وه، سه رکه وتن، ئامرازی چونه بان.

موسا: پێغه مبه ری موسایی، حه زره تی موسای کوری عیمران

موعته زیله: ده سته یێ له ئه هلی سوننه ت وجه ماعه ت بون که له ڕۆژگاری به نی ئومیه دا سه ریان هه ڵدا و بنچینه دانه ری ئه و ده سته واصل بن عه تا یه که فه قێ حه سه ن به صری بوه و له ۱۱۰ مانگی مردوه. له ڕێگای فه لسه فه وه، ته وحید بۆخوا، نه فی جیسمیه ت له خوا وعه دل بۆخوا و... ده سه لماندو ئوصولی ئه قیده‌یان ئه م پێنجانه بوه ۱. مه نزلی بین المنزلین ۲. توحید ۳. عدل ۴. وعدو و عید ۵. ئه مر به چاکه و نه هی له خراپه.

## ن

نمرود: ناز ناوی پاتشای که لده (بابل) ه ناوی نینوس، که شاری بابل ئه وسازی داوه و له گه ڵ حه زره تی ئیبراهیم دژ بوه ــ نمرود: شارێکه له باشور و وێرانه که ی له ۴ کیلۆمیتری سه لامیه ی عێراقه و شه لمنه صر سازی داوه.

نه هی: مه نع ، گێڕانه وه، دست به سینگه وه نان.

نه زان: نه فام، بێ زانست، بێ فه رهه نگ، نه خوێنده وار .

## و

وزه: هێز، ده سه ڵات، قووه ت

وڵسات: ئاژاڵ، پاتاڵ، مه ر و ماڵات

وشکه ڵ: لکی داری ، وشکی دار ــ وشکه دار ــ چرپی و چاڵی ویشک

وردبونه وه: سرنجدان، دیقه ت کردن.

## هـ

هزر: بیر، میشک

هه ڵدان: روشت کردن، نمو

هه زم: ده رک، توانه وه

هه ڵه نگوتن: لوت به لوته وه نان، سه ره نگرێ بردن، سه رسم دان

هه ڵێ: ده رکه وێ، رابکا

هه ڵاتن: ده رکه وتن، را کردن

هه ڵده چێ: ده چێته سه رێ، که ف ده کا بۆسه رێ، شیره که، هه ڵده چێ

هۆ: سه به ب، عیلله ت.

ئیبنی توفه یل: ئه بوبه کر محه مه د کوڕی عه بدولمه لیک، کوری محه مه د، کوری محه مه د ــ قیسی، پزیشک، فه یله سوف، شاعیر، وه زیر، فه قیهـ، ئه ند و لوسی، ده ڵێن: له نیوان ساڵه کانی:

۴۹۵ تا ۵۰۵ مـانگی /۱۱۰۲ تا ۱۱۱۱ زاینی له دایک بوه و له ۵۸۱ مـانگی و ۱۱۸۵ زاینی وه فـاتی کـردوه و حـه یی کـوڕی یه قزانی نوسیوه (شه پۆل).

## دفتر نشر فرهنگ اسلامی منتشر کرده است:

---

**خاندان وهب**

تألیف: سیدمحمود سیاهپوش

**آدم و حوّا**

تألیف: عبدالکریم بی‌آزار شیرازی

**اصیل آباد**

تألیف: رضا رهگذر

**آفریدگار یکتا**

تألیف: شهیدعلیرضا تقدس

**رستاخیز**

تألیف: عبدالکریم بی‌آزارشیرازی

**روز شهادت و خون**

تألیف: سیاوش امیری

**رودخانه**

تألیف: عبدالکریم بی‌آزارشیرازی

**دنیای ناشناخته نیایش**

تألیف: شهید علیرضا تقدس

## دفتر نشر فرهنگ اسلامی منتشر کرده است:

---

**سلمان فارسی**

تألیف: عباس ملکی

**زندگی گلها**

تألیف: عبدالکریم بی‌آزارشیرازی

**راز پرندگان**

تألیف: عبدالکریم بی آزارشیرازی

**قصه شعیب**

تألیف: سیّدعلی محمودی

**قصّهٔ کافران**

تألیف: ق.حسین‌نژاد

**داستان حضرت نوح**

تألیف: علی موسوی گرمارودی

**بیونیک یا الهام صنعت از خلقت**

تألیف: عبدالکریم بی‌آزار شیرازی

**ابراهیم در مصاف شرک با نمرود**

ترجمهٔ: سیدمحمد شریف حجتی

## دفتر نشر فرهنگ اسلامی منتشر کرده است:

---

**نواب صفوی**

**تألیف: علی موسوی گرمارودی**

**گردون سپهر**

**تألیف: عبدالکریم بی‌آزار شیرازی**

**قیس بن مُسهّر**

**تألیف: سیّد محمد سیاهپوش**

**کبوتر نوح**

ترجمهٔ: عباس خدابنده

**میمونهای انسان‌نما**

ترجمهٔ عبدالکریم بی‌آزار شیرازی

**زکریای رازی**

تألیف: علی موسوی گرمارودی

**مورچه‌ها**

تألیف: عبدالکریم بی‌آزار شیرازی

**شهر زنبوران**

تألیف: عبدالکریم بی‌آزار شیرازی